# 61 ناونیشانی پرفرۆش بۆ نوسینی ریکلام






نوسەر نەزمی قادر

سود لەم ناونیشانە ئامادەکراوانە وەربگرە
بۆ نوسینی ریکلامی بەرهەمەکەت .




ئایا ئەزانیت ! 95% ی مرۆڤەکان تەنها
ناونیشانی ریکلامەکان ئەخوێنەوە ؟

# بەناوی خودای گەورە

نـــاوی کتێـــــــــب: 61 ناونیشانی پرفرۆش بۆ نوسینی ریکلام

نووسیــن و ئامادەکردن : نەزمی قادر تەوێڵەیی

نـــــــــرخ : خـــــۆرایی و بێبەرامبەر

**ئەم کتێبە زنجیرە بەرهەمی** ئەکادیمیای ئاوەزهۆم ە

ئێمە خزمەت و بەرهەم و بڵاوکراوەکانمان لە هەمو کوردستاندا هەیە

ویب سایتی

www.awazhome.com




## ئەم بەرهەمە بە خۆراییە و بۆ بەکارهێنانی گشتیە تۆی خوێنەر ئەتوانیت:

- **لە ناو سایت و ماڵپەرە گشتییەکان بڵاوی بکەیتەوە .**
- **ئەتوانیت بینێریت بۆ هاورێکانت .**
- **وە بە هیچ شێوەیەك نابێت بیفرۆشیت .**
- **ئەتوانیت لەناو گروپەکانی تۆری کۆمەڵایەتی بڵاوی بکەیتەوە .**
- **بە هیچ شێوەیەك نابێت دەسکاری ناوەرۆکی بکەیت .**

**بەڵام تکایە لە کاتی بەکارهێنانی ناوەرۆکی ئەم بەرهەمە ناوی سایتی فێرکاری ئاوەز www.awazhome.com بنوسن .**




بروانامەی نێودەوڵەتی MIND MAP لە بواریی گەشەپێدان و پێشخستنی بزنس و کۆمپانیاکان .

دامەزرێنەر و خاوەنی ئەکادیمیای ئاوەز هۆم AwazHome بۆ ڕاهێنان و ڕاوێژکاریی .

خاوەنی بروانامەی MBA (Master of Business Administration) لە بواری سەرکردایەتیی و بازارسازی و فرۆش و براندینگ و ...

بروانامەی TOT نێودەوڵەتی بۆ پێگەیاندنی ڕاهێنەر و ڕاوێژکار .

ڕاهێنەر و ڕاوێژکاریی پەرەپێدانی دەیان بزنس و کۆمپانیای کوردستان.

ڕاوێژکاریی بۆ دامەزراندنی دەیان بزنس و ئیش و کار لە کوردستان.

خاوەنی وێب سایتی awazhome.com لە بواریی فێرکاریی سەرکردایەتی ، مارکێتینگ ، فرۆش و پەرەپێدانی بزنس و کەسێتی .



# لە کۆتایی کتێبەکەوە پێشنیازێکی گرنگ

## نهێنیەکە ئاشکرا ئەکەم ...

لە زانستی ریکلام نوسیندا 5 قاڵب(پێنج یاسا) ی ئامادەکراو دۆزراوەتەوە کە هەر کەس بتوانێت بە دروستی بەکاریان بهێنێت فرۆشی چەندین بەرامبەر زیاد ئەکات و دەگاتە دەرامەتێکی زۆر باش . ئەوانیش بریتین لە :

1/ X ڕێگا بۆ y بۆ نمونە / 3 ڕێگا بۆ خۆشبەختی .

2/ X خاڵ بۆ y تەنها لە z

3/ X ئامراز(هۆکار) y

4/ X ڕێگا بۆ y

5/ ئەنجامی X بە بێ y

لەوانەیە مێشکت ئالۆز بکات و بلێت من لەمە تێناگەم ! هەقت پێ ئەدەم چونکە شارەزاییت نیە لە زانستی ریکلام نوسیندا وە فێریش نەکراویت ، بۆیە ئاساییە ، هەر لەبەر ئەوەیە ئەم کتێبەم نوسیوە تا فێرت بکەم و بگەیتە فرۆش و دەرامەتێکی باش . بۆیە رازی سەرکەوتن لە دۆزینەوەی نهێنیەکانی ئەم کتێبە ئەوەیە بەردەوام بیخوێنیتەوە چونکە هەرجارەو شتێکی نوێ بەدەست ئەهێنیت .

ئەم چیرۆکانە ماوەیەك پێش ئێستە رویان داوە :

- ♥ لە دیداری راوێژکاریدا پێم وت سێ مۆدێلی نوسینی ریکلام هەیە ئێوە مۆدێلی کلاسیك بەکار ئەهێنن بۆیە فرۆشتان زۆر کەمە ! زۆر سەری سورما !!! پاشان شێوازەکانم بۆ خستە رو چەند تەکنیکێکم پێوت بۆ نوسینی رێکلامی کاریگەر وتم ئەم ماوەیە شێوازەکەت بەم جۆرە بگۆرە ، پاش سێمانگ جێبەجێکردن وتی 30هەزار دۆلار(3 دەفتەر دۆلار) قازانجم کردوە .
- ♥ دامەزراوەیەکی ئەهلی خولێکیان راگەیاندبوو بۆ راهینەرێکی نێودەوڵەتی ، بە بڕوای ئەوان ئەگەر بنوسن راهێنەری نێودەوڵەتی ئیتر خەلك پارە ئەدات و خێرا بلیتەکان ئەفرۆشرێت ! ئەم کارە روی نەدا وە هیچ شارەزایشیان لە زانستی ریکلام نوسیندا نەبو . چەند رۆژێکی کەمی مابو بۆ خولەکە پەیوەندیان پێوە کردم داوایان لێکردم

چارەسەرێکیان بۆ بدۆزمەوە . بەو شارەزاییەی کە هەمبو لە نوسینی ریکلامی کاریگەر و بازاردۆزی چارەسەری کێشەکەیانم کرد ، هەرچەندە کاتەکەیش درەنگی کردبوو بەڵام برێکی زۆر باش بلیتان فرۆشت .

- گروپێکی تر بانگهێشتی راهێنەرێکی دەرەوەیان کردبوو بە بۆچونی خۆیان خەڵێکی زۆر دێت چونکە ناوەرۆکی بابەتەکەی پێویستی خەڵکە و بلیت زو تەواو ئەبێت . پاش ماوەیەك لە ریکلامی زۆر و سپۆنسەر کردن لە چاوەڕوانی ئەواندا نەبو رێژەیەکی زۆر کەم کۆبونەوە . پێم وتن کێشەی ئەم هەنگاوەی ئێوە لە جۆری ریکلام و بازاردۆزیدایە . ئەوان نازانن ریکلامی بەرهەمەکانیان بکەن و شارەزاییان لە کەمپەینی بازار دۆزی نیە بۆ زیادکردنی فرۆشیان بە کەمترین نرخ و تێچوون .
- هەندێ شوێنی تر بانگهێشتی کەسانی لێهاتو و شارەزایان کردوە و هۆڵی ئۆتێلی پێنج ئەستێرەیان گرتوە بەڵام لەبەر نەبونی بەژداربوو بێبەرامبەر پێشکەش کراوە ، زەرەرێکی زۆریان کردوە ، تەنها لەبەر شارەزا نەبون لە زانستی ریکلام نوسین .

## پێشەکیەکی زۆر پێویست

مۆدێلی بزنسەکەی تۆ ئەکرێت یەکێك بێت لەم دو جۆرە :

1- کارلێك و بەرپەرچدەرەوە (reactive) : لەم مۆدێلە (فرۆش ، کریار ، بەژداربوو) شوێنکەوتەی روداو و پشوەکانە ، واتە ئەگەری زۆرە لەکاتی پشوەکان فرۆش زۆر بێت ، یان لە وەرزێکی دیاریکراو بەژداربوو زۆر بێت ، لە وەرزی تر کەمتر بێت . یان لە بۆنە و ئاهەنگێك موشتەری زۆرە . لەم مۆدێلە چاوەڕێ ئەکرێت تا کریا و موشتەری شتەکان بکرێت .

هەرچەندە سپۆنسەر و ئامرازەکان زیاتر ئەکەیت هەر جواب ناداتەوە !

(بە گشتی لەم جۆرەی بزنسە ناگەیتە دەرامەت و فرۆشێکی باش ، چونکە بارودۆخ و ژینگە زیاتر زاڵە بەسەر بزنسەکە)

2- کارپێکردن و کاریگەر (proactive) : زۆرینەی کۆمپانیا بەناوبانگەکانی جیهان ئەم مۆدێلە سەرکەوتوە بەکار ئەهێنن وە خۆیان دەست نیشانی ئەکەن کە ئەمرۆ یان ئەم حەفتە چەنێك فرۆشیان هەبێت ! نەوەك بارو دۆخ و ژینگە ئەم فرۆشە دەسنیشان بکات .

دڵنیاین تۆ یەکێکت لەوانەی ئەتەوێت بزنسەکەت لە چوار وەرزە فرۆشی هەبێت و بۆنەو ئاهەنگ و جەژن و پشوەکان کار نەکاتە سەر گەشەی بزنسەکەت بۆ ئەوەی بگەیتە دەرامەتێکی زۆر و سەرکەوتنێکی بەرچاو .

یەکێك لە ریگاکانی گەیشتن بە خاڵی دوەم ئەوەیە کە کارامەیی و لیهاتویی پەیدا بکەیت لە نوسینی ناونیشان و ریکلامی کاریگەر .

**سەرنجێکی گرنگ**

هەر ریکلامێکی نوسراو یان ڤیدیۆیی یان دەنگی لە شەشە بەش پێکهاتووە

لێرەدا باسی بەشی یەکەم دەکەین کە پێکهاتوە لە ناونیشان (تایتڵ) کە کاریگەرترین بەشی ریکلام نوسینە .

## چۆنیەتی سود وەرگرتن لە ناونیشانەکان بۆ نوسینی ریکلامەکەت

نمونە /

ئایا تۆیش ئەتەوێت لە رێگەی کۆمپیوتەرەوە دەرامەت پەیدا بکەیت ؟

ئایا تۆیش ئەتەوێت لە رێگەی ــــــــــــــــ دەرامەت پەیدا بکەیت ؟

تۆ ئەتوانیت ئەم بۆشایەی ئێمە بە خواستی خۆت پر بکەیتەوە بۆ ئەو بەرهەمەی کە ئەتەوێت ریکلامەکەی بۆ بنوسیت .وەك مۆبایل . فۆتۆگرافەر . وێنەکێشان . ئینستاگرام .

کەواتە بەم شێوەیەی لێ دێت :

ئایا تۆیش ئەتەوێت لە رێگەی مۆبایلەوە دەرامەت پەیدا بکەیت ؟

نمونە /

ئەتەوێت کامیان هەڵبژێریت ؟ سەیرکردنی تی ڤی یان دەستکەوتنی داهات لەماڵەوە ؟

ئەتەوێت کامیان ــــــــــ ؟ ــــــــــ یان ــــــــــ ؟

ئێمە ئەم ریکلامە بۆ مەبەستی خۆمان بەم شێوەیە ئەنوسین

ئەتەوێت کامیان هەڵبژێریت ؟ سەعیکردنی زۆر و نمرەی کەم ؟ یان سەعیکردنی کەم و نمرەی بەرز ؟

1-بۆچی کەسانی قسەخۆش و کراوە لە بزنس سەرکەوتو ئەبن بەڵام کەسانی پارێزکار و کەم قسە شکست ئەخۆن ؟

بۆچی کەسانی ــــــــــ سەرکەوتوو ئەبن ، بەڵام کەسانی ــــــــــ سەرکەوتوو نابن ؟

2-تۆ ئەتوانیت بە دیاریکردنی 12 خولەك لە رۆژێکدا ببیتە خاوەنی جەستەیەکی رێك و تەندروست .

تۆ ئەتوانیت بە ــــــــــ ببیتە خاوەنی ــــــــــ .

3-بۆچی ئێمە ئەم بەرهەمە بە نرخی 5 هەزار دینار ئەفرۆشین ؟
بۆچی ئێمە ________

4-ئایا تۆیش ئەتەوێت لە ڕێگەی کۆمپیوتەرەوە دەرامەت بە دەست بهینیت ؟
ئایا تۆیش ئەتەوێت لە ڕێگەی ________ دەرامەت بەدەست بهێنیت ؟

5-ئایا ئەتەوێت تەنها لە نیوکاتژمێر کێکێکی بە تام دروست بکەیت ؟
ئایا ئەتەوێت تەنها لە ________ دروست بکەیت ؟

6- ئەتەوێت لە کام نەخۆشی پێست رزگارت ببێت ؟
ئەتەوێت لە کام ________ رزگات ببێت ؟

7- ئەتەوێت کێشەی ناتەندروستی لە ناو ببەیت ؟
ئەتەوێت ________ لەناو ببەیت ؟

8-پارە لە کوێیە و چۆن بتوانم بە دەستی بهێنم ؟
________ لە کوێیە و چۆن ________ ؟

9- ئەتەوێت کامیان هەڵبژێریت ؟ سەیرکردنی تی ڤی یان دەستکەوتنی داهات لە ماڵەوە ؟
ئەتەوێت کامیان ________ ؟ ________ یان ________ ؟

10-ئەو ڕێگایەی کە هەر خاوەنی بزنسێك ئەبێت بیزانێت .
ئەو ڕێگایەی کە هەر ________ ئەبیت بیزانێت .

11-لە مۆبایلەکەی خۆت سود وەربگرە بۆ بەدەست هێنانی دەرامەت .
لە ________ سود وەربگرە بۆ ________ .

12- ئایا ئەزانیت کەم کەس ئەتوانێت لە ڕێگە ئینتەرنێتەوە داهاتی هەبێت ؟ بۆچی ؟
ئایا ئەزانیت ______ هەبێت ؟ بۆچی ؟

13-ئەو پیشەی کە دوای 3 ساڵ کارکردن ئەتوانی خانەنشین بیت .
ئەو ______ دوای ______ .

14-ئایا لە کارکردن بۆ کەسانی تر ماندوو بویت ؟
ئایا لە ______ ماندو بویت ؟

15-ئایا ئەزانیت جێبەجێکردنی تەکنیکی بزنسی کەسیتی ئەگەر ڕۆژانە چوار کاتژمێر کار بکەیت دەرامەتی مانگانەت زیاترە لە یەك ملیۆن دینار ؟
ئایا ئەزانیت ______ ئەگەر ڕۆژانە ______ زیاترە لە ______ .

16-ئەو زانیارانەی کە خاوەکارەکان هیچکات پێتان نالێن .
ئەو ______ کە ______ هیچکات پێتان ناڵێن .

17- ڕاستییەکی نەخوازراو و ناخۆش لەبارەی مۆبایلەکەی تۆوە .
ڕاستییەکی نەخوازراو و ناخۆش لە بارەی ______ .

18- ئەم خۆراکە نهێنی هەبونی پێستێکی نەرم و سەرنجراکێشە .
ئەم ______ نهێنی ______ .

19 – نهێنی هەبونی ڕوخسارێکی سەرنج ڕاکێش .
نهێنی هەبونی ______ .

20- ئەو کەسانەی ئەم کتێبە ئەخوێنەوە ئەگەنە خۆشبەختی .
ئەو کەسانەی ______ ئەگەنە ______ .

21-خێراترین ڕێگا بۆ دابەزاندنی کێشە .

خێراترین ڕێگا بۆ ________ .

22- ڕێگایەکی سەرسورهێنەر بۆ فێربونی شۆفێری .
ڕێگایەکی ________ بۆ ________ .

23-یا سود وەربگرە لە بەرهەمەکەمان یان پارەکەت وەربگرەوە .
یان ________ یان ________ .

24- ئایا ئەزانیت کەسانی سەرکەوتوو چ ڕۆژنامەیەك ئەخوێنەوە ؟
ئایا ئەزانیت ________ چ ________ .

25- نۆ ڕێگای کەسانی تەمەڵ بۆ ساماندداربون .
________ ڕێگای کەسانی ________ .

26- ئایا ئەزانیت هەبونی وێب سایت ڕێگایەکی زۆر باشە بۆ زیادبونی دەرامەت ؟
ئایا ئەزانیت ________ ڕێگایەکی زۆر باشە بۆ ________ .

27- دە ڕێگا بۆ ڕاکێشانی سەرنجی موشتەری لە کەمترین کاتدا .
________ ڕێگا بۆ ________ لە ________ .

28-وەك ئەمریکایەك بە زمانی ئینگلیزی قسە بکە .
وەك ________ بە زمانی ________ قسە بکە .

29-موزیك ژەنی کورد ڕێگایەکی دۆزیوەتەوە بۆ فێربونی پیانۆ لە 10 ڕۆژدا .
________ ڕێگایەکی دۆزیەوە بۆ ________ لە ________ .

30- ئایا تەندروستی منداڵەکەت 100هەزار دینار ئەرزشی نیە ؟
ئایا ________ ئەرزشی نیە ؟

31- ئەگەر بتوانیت فێری شۆفێری ببیت کەواتە ئەتوانیت فێری خێراخوێندنەوە ببیت .
ئەگەر بتوینیت ______ کەواتە ئەتوانیت ______

32- مێشك لە ماسولکە پێکهاتوە بە راهێنانکردن ئەتوانیت بەهێزتری بکەیت .
______ لە ______ پێکهاتوە بە ______ ئەتوانیت ______ .

33- چۆن کتێبێك ئەنوسیت بۆ ئەوەی ساماندارت بکات ؟
چۆن ______ بۆ ئەوەی ______ ؟

34-چۆن ریگریەکان بکەینە دەرفەتێکی مەزن لە ژیاندا ؟
چۆن ______ بگەینە ______ ؟
35- چۆن بەهۆی بەرنامەرێژییەوە بتوانین رۆژانە 4 کاتژمێر کاتمان بۆ بگەریتەوە ؟
چۆن بە هۆی ______ بتوانین ______ ؟

36- زۆرتر بخۆن و کەمتر قەڵەو ببن .
زۆرتر ______ و کەمتر ______ .

37- بۆ هەر ریکلامێك کە دروستی ئەکەیت زیاتر لە یەك ملیۆن بە دەست بهێنە.
بۆ هەر ______ زیاتر لە ______ .

38-دانپیانەرێکی چێشلێنەر رازێك ئاشکرا ئەکات .
______ رازێك ئاشکرا ئەکات .

39-حەوت رێگا بۆ رزگار بون لە کارمەندی .
______ رێگا بۆ ______ لە ______ .

40- له كۆتایدا رێگایەكی جیاواز بۆ پرفرۆشكردنی بەرهەمەكان دۆزرایەوە .
له كۆتایدا رێگایەكی ______ بۆ ______ دۆزرایەوە .

41- هیچ پارەیەك مەدە بۆ كرینی ئەم كتێبە ئەگەر دەرامەتی دوبەرامبەر زیاد نەكردی !
هیچ ______ بۆ ______ ئەگەر ______ !

42- بۆچی هونەرمەندان تا تەمەنی 60 ساڵی هەر گەنج و جوان ئەكەونە بەرچاو ؟
بۆچی ______ تا ______ هەر ______ .

43- ئایا بە باوەڕی تۆ بەدەستهێنانی دەرامەت بە ئاسانی ئەستەمە ؟
ئایا ______ ئەستەمە ؟

44- بۆچی ئەوانەی لە نێوان 25 تا 35 هاوسەرگیری ئەكەن خۆشبەخترن ؟
بۆچی ______ تا ______ .

45- پاكردنەوەی شوێنە هەستیارەكانی ماڵەكەتان بسپێرن بە ئێمە .
______ پسپێرن بە ئێمە .

46- ئایا ئەزانیت پزیشكەكان چ چارەسەرێك بۆ خۆیان بەكار ئەهێنن ؟
ئایا ئەزانیت ______ چ ______ بەكار ئەهێنن ؟

47 –زۆرێك ئەیانوت ناكرێت بەڵام لە یەك شەودا كتێبێكم نوسی .
______ ئەیانوت ناكرێت بەلام ______ .

48- زۆرینەی فێرخوازان وا ئەزانن سەعیكردنی زۆر ئەبێتە هۆی بەدەستهێنانی نمرەی بەرز .
زۆرینەی ______ وا ئەزانن ______ ئەبێتە هۆی ______ .

49- تا ئێستا چەند جار هەوڵی فێربونی زمانت داوە بەڵام لە نیوە وازت لێ هێناوە ؟
تا ئێستا چەند جار _______ بەڵام _______ ؟

50- زۆرینەی قوتابیان وا ئەزانن تەنها بە بەژداریکردن لە خولی بەهێزکردنی هاوینە نمرەی بەرز بەدەست ئەهێنن .
زۆرینەی _______ وا ئەزانن تەنها _______ بەدەست ئەهێنن (سەرکەوتوو ئەبن) .

51- ئایا ئەو ماڵەی کە خەونت پێوە ئەبینی ئەمەیە ؟
ئایا _______ ئەمەیە ؟

52- چ هەستێکت هەیە ئەگەر رۆژانە 10 کاتژمێر کاربکەی بێ ماندوبون و بە چێژەوە .
چ هەستێکت هەیە ئەگەر _______

53- تەنها رێگای نوسینی کتێب لە 27 رۆژدا .
تەنها رێگای _______ لە _______ .

54- چۆن بێ نیگەرانی و دودڵی شمەك بکڕم ؟
چۆن بێ نیگەرانی و دودڵی _______ ؟

55- چۆن لە رێگەی تۆری کۆمەڵایەتیەوە توانا و لێهاتویەکانت ئەفرۆشیت؟
چۆن لە رێگەی _______ ئەفرۆشیت ؟

56- رازی فرۆشتنی بەرهەمەکانت لە رێگەی ئینستاگرامەوە .
رازی _______ لە رێگەی _______ .

57- چۆن چاوپێکەوتنەکانی رادیۆ و تی ڤی بۆ فرۆشتنی بەرهەمەکانت بەکار ئەهێنیت ؟
چۆن ـــــــــ بۆ فرۆشتنی ـــــــــ بەکار ئەهێنیت ؟
58- چۆن لە رێگەی نوسینی کتێبەوە دەوڵەمەند ئەبیت ؟
چۆن لە رێگەی ـــــــــ ئەبیت ؟
59- زۆر کەس وائەزانن بە هۆی دیزاین و فۆتۆگرافەریەوە ناتوانیت بگەیتە داهاتی زۆر باش ؟
زۆر کەس وا ئەزانێت بە هۆی ـــــــــ و ـــــــــ ناتوانیت بگەیتە ـــــــــ .
60- ئەو پێنج یاساییەی کە بە ئاسانتر فێری زمانت دەکات .
ئەو ......... یاسایەی کە ئاسانتر ..............
61- بۆ دور کەوتنەوە لە نەخۆشەکانی پێست دەبێت بەکاری بهێنیت .
بۆ دروکەوتنەوە لە .................. دەبێت ......................

خۆت فریو مەدە باشترین بەرهەم و کالاَی هەر برێندێکت هەبێت بە بیَ زانینی ریکلام نوسینی پێشکەوتوو کەس نایکرێت ! بۆیە پێویستت بە فێربوونی ئەم زانستە هەیە.
ئەگەر خۆت خاوەنکاریت یان خاوەن پڕۆژە یان فرۆشیاریت پێسویتت بەم زانستە دەبێت ، ئەگەر وا دەزانیت خۆت کاتت نییە یەکێک لە باشترین کارمەندەکانت بنێرە با گۆڕانکاریی گەورە لە بزنسەکەت دروست بکات.

**کلیك بکە**

**خولی پێشکەوتووی بزنسی کەسێتی - سەرکردایەتی - براندینگ**

**کلیك بکە**

**خولی ئۆنلاینی هونەریی ریکلام نوسینی کاریگەر لە ئینتەرنێت و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان**